شێک لە پەیامەکانی نوور

# وتە بچووکەکان




بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی




بەشێك لە پەیامەکانی نوور

# وتە بچووکەکان

بەدیعوززەمان

## سەعیدی نوورسی

داینا وە

فاروق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

# پێشەکیی وەرگێر

**مێژووی ئیسلام و زانایانی تازەکەرەوەی ئایین:**

ئەگەر بە وردی سەرنجێك لەو قۆناغانەی مێژووی ئیسلام بدەین کە ئیمان لەناو دڵاندا لاواز بووە و ئیسلام لە واقیعی ژیان دوور خراوەتەوە، دەبینین لەم جۆرە کاتانەدا ئیمانداران خۆیان لە بارێکی ناهەمواردا دیوەتەوە و، هەستیان بە بوونی مەودایەکی فراوان کردووە لە نێوان واقیعی خۆیان و ئیسلامەکەیاندا. بەڵام زۆری نەخایاندووە کە تۆزی لاوازی و کزبوونی ئیمانیان لەسەر شان و دڵی خۆیان داتەکاندووە و، پتر لە جاران دەستیان بە ئایینەکەیانەوە گرتووە و، هەنگاویان بەرەو پێشتر ناوە.

پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر بێت - لە فەرموودەیەکی بەرز و پیرۆزیدا ئاماژە بۆ ئەم ڕاستی‌یە دەکات و دەفەرموێت:

"بدأ الإسلام غريباً، وسيعود غريباً كما بدأ، فطوبى للغرباء"(١).

کاتێك کە مەبەستی خۆی لە (الغرباء) ڕوون کردەوە، فەرمووی:

"الذين يصلحون ما أفسد الناس ما بعدي من سنتي"(٢).

---

(١)رواه مسلم عن أبي هريرة. ورواه الترمذي. واتە: ئایینی ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێ کردووە و سەرلەنوێش بە نامۆیی دێتەوە، خۆشبەختی بۆ ئەو نامۆیانە.

(٢)رواه الترمذي عن زيد ابن ملحة عن أبيه عن جده. واتە: ئەو نامۆیانە ئەوانەن کە چاکسازی لەو لایەنانەی سوننەتی مندا دەکەن کە خەڵکی دوای من تێکیان داون.

له‌و چه‌شنه قۆناغانه‌ی مێژووی ئیسلامدا، ده‌ستی توانستی خوای په‌روه‌ردگار - كه له سه‌رووی هه‌موو توانایه‌كه‌وه‌یه - په‌یتا په‌یتا زانای به‌رز و ئاگادار و وریا و لێهاتووی هێناوه‌ته كایه‌وه، كه ئه‌ركی تازه‌كردنه‌وه‌ی ئایینیان له ناو دڵاندا گرتووه‌ته ئه‌ستۆ و، ڕۆڵێكی تابڵێی باڵایان له هێشتنه‌وه‌ی ئه‌م ئیمانه‌دا بینیوه به‌و شێوه پرشنگداره‌ی كه هه‌ر له سه‌رده‌می په‌یدابوونی ئیسلامه‌وه تا ئێستا بێ وچان ڕێی خۆی بڕیوه و، له به‌رامبه‌ر هه‌موو گه‌رده‌لوول و ته‌گه‌ره‌یه‌كدا توانیویه‌تی له گه‌شتی خۆی به‌رده‌وام بێت و، ئاسووده‌یی و ئاسایش بڵاو بكاته‌وه.

پێویستیی ئیمان و ئیمانداران به زانایانی نوێكه‌ره‌وه‌ی ئایین له‌م فه‌رمووده‌یه‌ی پێغه‌مبه‌ره‌وه - دروودی خوای له‌سه‌ر بێت - به ڕوونی ده‌رده‌كه‌وێت كه ده‌فه‌رموێ:

"إن الله تعالى يبعث لهذه الأمة على رأس كل مئة سنة من يجدد لها دينها"[١].

چونكه ژیانی ئه‌و جۆره زانایانه و به‌روبوومه‌كانیان و ئه‌زموونی ئه‌وان له‌و ئه‌ركه‌دا: توێشووی سه‌فه‌ر و مه‌عالیمی ڕێگا و هاوڕێی ئیماندارانن له‌م گه‌شته‌ی ژیانی دنیادا.

ئه‌و مه‌رجانه‌ش پێویست بن بۆ زانایه‌ك كه بتوانێ به‌هۆیانه‌وه ئه‌و ئه‌ركه گه‌وره‌یه ئه‌نجام بدات كه ده‌كه‌وێته ئه‌ستۆی، چه‌ند مه‌رجێكی ئه‌وتۆن زۆر به نایابی له‌ناو زانایانی چه‌رخه‌كه‌یدا ده‌ست ده‌كه‌ون و، هه‌ر به‌و مه‌رجانه‌ش پله‌ی به‌رزی ئه‌و زانایانه ده‌رده‌كه‌وێت و له كه‌سانی تر جیا ده‌كرێنه‌وه.

---

(١) رواه أبو داود والحاكم والبيهقي عن أبي هريرة - حديث صحيح. واته: خوای گه‌وره له سه‌ری هه‌موو سه‌د ساڵێكدا یه‌كێك ده‌نێرێت بۆ ئه‌م نه‌ته‌وه‌ی ئیسلامه هه‌تا كاروباری ئایینیی بۆ نوێ بكاته‌وه.

پێویستە تازەکەرەوە، پێش هەموو شتێك، ئەوە بزانێ کە لە چ ڕێگایەکەوە دەتوانێت بڕواتە ناو دڵ و دەروونی هاوچەرخانی تاکو ئیمان بەو دڵانە بگەیەنێت؟

هەروەها دەبێ زۆر بە فراوانی و پاکی لە هەموو لایەنەکانی ئیسلام گەیشتبێت و، لە نهێنییەکانی ئیمان و کاکڵە و ناوەڕۆك و گیانی قورئان زۆر بە باشی ئاگادار بێت..

هەروەها دەبێ - کە ئەمەش زۆر پێویستە - بە وردی لە گیانی ئەو چەرخەی تیایدا دەژی گەیشتبێ و، ئەو شتانەش کە بیر و هۆش و دەروونی مرۆڤەکانی ئەو چەرخەی گرتووە و بایەخیان پێ دەدرێ بزانێ چین و، ئەو گیرو گرفتانەش دێنە ڕێیان لە چ جۆر و بارەیەکەوەن؟ هەر لەبەر ئەمەشە کە پێویستە ئەو جۆرە زانایانە لە هەموو چەرخ و دەورانێکدا ببن، تاکو بە پێی ئەو چەرخە و لە ڕوانگەی داخوازییەکانیەوە ئەرکەکانیان ڕابپەڕێنن و، دەردەکانی کۆمەڵگای خۆیان بزانن بۆ ئەوەی بتوانن چارەسەری پێویست و شیفابەخشیان بۆ دەستنیشان بکەن.

ئەمەش یەکێکە لە نهێنییەکانی نەمری و هەمیشەیی قورئان و ئەم ئایینەی کە خوای گەورەی باڵادەست خواستی لەسەر هەمیشەیی و بەردەوامی و جیهانگیریی بووە و، لە چەندین ئایەتدا ئەمەی دەرخستووە، وەك دەفەرموێ:

﴿ولقد كتبنا في الزبور من بعد الذكر أن الأرض يرثها عبادي الصالحون۝ إن في هذا لبلاغاً لقوم عابدين ۝ وما أرسلناك إلاّ رحمة للعالمين﴾ (الأنبياء: ١٠٥-١٠٧).

هەرچەندەش ئەرکی سەرشانی ئەو زانا تازەکەرەوانە لە بنەڕەتدا هەر یەك شتە، کە نوێکردنەوەی ئیمانە لە دڵ و دەروونەکان و واقیعی ژیاندا، بەڵام هەریەکەیان لە شێوازی کار و جۆری بیرکردنەوە و ڕێبازی بەڕێوەبردنی

ئەرکی خۆیدا لەوانی تر جیایە و، هەریەکەو بە گوێرەی چەرخی خۆی و پلەی لاوازیی ئیمان لەناو دڵی هاوچەرخانی خۆیدا و جۆری ئەو گەردەلوولانەش کە بەرەو ڕووی ئیمان دەبنەوە لەو سەردەمەدا، ڕادەپەڕێ و ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ دەهێنێ. واتە ئەو تازەکەرەوەیەی لە چەرخێکدا دێت کە ئیمان لە لاوازی و کزبووندایە، جیاوازە لەوەی کە لە سەردەمێکدا دێت پاچ و قولنگی کاولکاری و گومان و دوودڵی لەسەر ڕەگ و بنج و بناغەکانی ئیمان خرابێتەکار.

بەم چەشنە، لە مێژووی ئیسلامدا چەندین بلیمەتی هەڵکەوتووی ئەوتۆ پەیدا بوون کە ئیمانیان لەناو دڵاندا دەچەسپاند و، ئەنجامی دەستکەوتی تاقیکردنەوەکانی خۆیان خستە بەردەست ئیمانداران، لەبارەی: موعاناتی "گیان" و پەیوەست کردنی "دڵ" بە خوای گەورەوە و پاکژ کردنەوەی "دەروون" لە هەموو پەیوەندییەك کە ڕێگای ئاخیرەتیان لێ بگرێت، بە جۆرێك کە ڕێگای ئیمانیان بە کراوەیی پیشانی ڕێڕەوانی داوە و، هەموو شیو و دۆڵ و کۆسپێکیان لەو ڕێیەدا بۆ ئاسان و ئاشکرا کردوون.

زانایانی وەك: (خەلیفەی ڕاشید عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ٦٢-١٠١ هـ) و (ئیمامی غەزالی ٤٥٠-٥٠٥ هـ) و (شێخ عەبدولقادری گەیلانی ٤٧٠-٥٦١ هـ) و (مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی ٦٠٤-٦٦٢ هـ) و (ئیمامی ڕەببانی ٩٧١-١٠٣٤ هـ) و (مەولانا خالیدی نەقشبەندی ١١٩٢-١٢٤٢ هـ) و چەندین زانای تری هاوچەشنی ئەمانە، بە درێژایی مێژوو، مروارییی پرشنگداری تاجی ئیمان و ئیسلامن، بە چەشنێك کە هەرگیزاو هەرگیز تێپەڕبوونی کات و تەپاوتلی ڕۆژگار ناتوانێ ڕووناکی و پرشنگدارییان لێڵ بکات و جێ دەستیان بسڕێتەوە.

**مامۆستا بەدیعوززەمان و پەیامەکانی نوور:**

خاوەنی ئەم کتێبە "بەدیعوززەمان مامۆستا سەعیدی نوورسی ١٢٩٣-١٣٧٩ هـ / ١٨٧٦-١٩٦٠ ز" کە زانایەکی تابلێی بلیمەت و کەم وێنە و هەڵکەوتووی ئەم چەرخەی ئێمەیە، وەك هەر زالایەکی ئیمانداری دڵسۆز، بە دڵ و دەروون و جەستەی خۆی لە قووڵایی ئەم چەرخەدا ژیاوە و، هەستی بە زامەکانی کردووە و هەوڵی چارەسەریانی داوە. هەر لەم پێناوەشدا ژیان و ئەزموون و بەرهەمی ئەو زانا ناوبراوانە و هاوچەشنی ئەوانی تاوتوێ کردووە و، ئاگاداریان بووە و، بە چاوی پەند و ئامۆژگاری و ڕابەری بۆی ڕوانیون و، سوودی گرنگی لێ وەرگرتوون.

بەڵام ئەو شتەی کە ڕێی لێ دەگرت تەنها بەرهەمی ئەو زانایانە بکاتە سەرمەشق و ڕابەری کارەکانی، ئەو جیاوازییە گرنگەی چەرخەکەی بووە لەگەڵ چەرخەکانی ئەو زاتانەدا..

بە چاوی خۆی دەیبینی ئەو گرفت و زام و دەردانەی ڕوو دەکەنە ئیمانداران لەم سەردەمەدا گەلێ جیاوازن لەوانەی کە ڕوویان تێدەکردن لە سەردەم و چەرخەکانی پێشوودا. ئەم زانایە بە چەشنێك لەم ڕاستییە گەیشتبوو کە هەمیشە بیری خۆی سەرقاڵی دۆزینەوەی چارەسەر کردبوو بۆ ئەو گرفت و زامانەی کە ئەم سەردەمە پێیانەوە دەناڵێنێت، ئەوەتا وەك ئاماژەیەك بۆ ئەم مەبەستە بە یەکێك لە قوتابیانی خۆی دەڵێت:

" ئەگەر من لە چەرخی (ڕۆمی)دا بژیامایە " مەسنەوی"م دەنووسی و، ئەگەر (ڕۆمی)ش لەم چەرخەدا بژیایە، "پەیامەکانی نوور"ی دەنووسی"[1].

---

(١) بڕوانە: Necmeddin Sahiner: "صۆن شاهیدلەر Son Sahitler" (دوا شایەتەکان) ١/ ٣١٢.

ئەگەر لە ڕووناکیی ئەم وتەیەی مامۆستا سەعیدی نوورسیدا بە وردی سەیری واقیعی ئەم چەرخە بکەین، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە چەرخێکە زۆر جیاوازە لەو چەرخانەی زانایانی نوێکەرەوەی پێشینی تێدا ژیاون؛ چەرخێکە وەك بوومەلەرزەیەکی سامناك لەرزەی بە هەموو بیر و باوەڕ و ڕەوشت و نەریتێکی مرۆڤایەتی خستووە و، دوودڵی و دڵتەنگی و گومانی تەنانەت لە شتانی بەدیهیشدا بڵاو کردووەتەوە.

لێرەدا زۆر بە وردی - هەروەك پێویست بوو- مامۆستا نوورسی ڕۆشتە ناو ناخی ئەم چەرخە و، بەقووڵی هەموو بارودۆخ و لایەن و زانستەکانی تاوتوێ کرد و، لە ناوەندی ئەو هەموو جۆرە تاریکی و بەدگومانی و دەردیسەرییانەی کە موسڵمانان گیرۆدەی بوون، ڕێگایەکی تایبەتی دۆزی‌یەوە و هەتا لە دنیادا ما لەسەری بەردەوام بوو.

بەم چەشنە، ئەم مامۆستا زانا و لێهاتووە قۆڵی لێ هەڵماڵی و چاکی لێبڕان و بێ وچانیی کرد بە لادا و، بڕیاری دا هەتا دوا هەناسەی ژیانی لە خزمەتی ئیماندا بێت و، موعجیزەکانی قورئانی پیرۆز دەربخات.

جا لەبەر ئەوەی زۆر بە باشی نرخی کاتی دەزانی، ئەوا بە هیچ جۆرێك کاتی بەنرخی خۆی لە شتی بچووك و هەندەکی و لاوەکیدا نەبردە سەر. بەڵکو یەکسەر تیشکی گەرمیی بیر و باوەڕە بەتینەکەی ئاراستەی ئەو بارە تەماوی‌یە کرد کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ چڕتر دەبوو لە مێشك و ئەندێشەی موسڵماناندا، سەبارەت بەو شتانەی لە ئایینی ئیسلامدا "غیبیات"یان پێ دەوترێ، وەك ڕۆژی دوایی و، حەشر و، دۆزەخ و، بەهەشت و، تۆڵە و پاداشت لە دواڕۆژدا.

بەم جۆرە، توانیی ئەو بارە تەماوی‌یە بکات بە هەڵم و لە ئەندێشە و هزری ئیمانداراندا هەڵیان بگرێت و بیاندات بە بادا و، شەوق و تاسە و ئەوین و

ئارەزوو لە ویژدان و دڵ و دەروونیاندا بهەژێنێ سەبارەت بەو ڕاستییە ناوبراوانەی ئیمان. هەموو ئەمانەش لە ڕێی نووسینی "پەیامەکانی نوور"ەوە کە تەوەرەی بنەڕەتییان باسکردن و لێکدانەوەی ڕاستییەکانی ئیمانە و، بە جۆرێکی ئەوتۆ ڕوونیان دەکاتەوە کە هیچ دوودڵی و گومانێکیان تێدا ناهێڵێتەوە.

ئەم پەیامانەش پتر لە سەد و سی پەیامن و، لە نێوان ساڵەکانی (١٩٢٦-١٩٥٠ز) دانراون، جگە لەو پازدە پەیامەی کە لە پێش ئەم مێژووەدا بە زمانی عەرەبی نووسیونی.

بەم جۆرە و لە ڕێی نووسین و بڵاوکردنەوەی پەیامەکانی نوورەوە، مامۆستا نوورسی لە شەوەزەنگی ئاسمانی تورکیای ئەو کاتەدا وەك مانگی چواردە هەڵهات و، ڕۆڵێکی یەکجار گەورە و گرنگی بینی لە دەرخستنی ڕاستییەکانی ئیمان و، جووڵاندنی هیممەت و غیرەتی ئیمانداراندا.. هەروەك بانگی خەڵکیی کرد بۆ برایەتی و، خۆشەویستی و، بنیاتنانی زات و، ڕزگار کردنی مرۆڤ لە هەموو جۆرە پەرستنێکی جگە لە پەرستنی پەروەردگاری بەدیهێنەر، وەك خۆپەرستی و، پەرستنی ئەو بتە نوێیانەش کە لە هێلانەی بیر و ڕا و بۆچوونە ماددییەکانی شارستانێتیی نوێدا پەیکەریان بۆ تاشرابوو.

مامۆستا نوورسی لەم پەیامانەدا بەڵگە لە دوای بەڵگەی عەقلی و زانستییانەی لەسەر ڕاستیی بیروباوەڕی ئیسلام دەهێنایەوە و، بە قەڵەمە کارامە و ڕەوانەکەشی فراوانی و بەربڵاویی ئیسلامی سەبارەت بە بوونەوەر و مرۆڤ و ژیان و کۆمەڵ دەخستە پێش چاو، هەروەك ئیعجازی قورئان و، ڕاستیی پێغەمبەر ﷺ و، دانایی شەریعەت و، مرۆڤایەتیی ئیسلام و، گەورەیی بیر و باوەڕە ڕۆحی و ڕەوشتییەکانی ئەم ئایینەی دەرخست و ڕوونی

کردەوە. هەموو ئەمانەش لەگەڵ تێگەیشتنێکی قووڵدا لە ناوەرۆك و سروشتی چەرخەکەی[١] و، ئاگاداریەکی تەواو لە ململانێی نێوان ئایدۆلۆجیا و بیروڕاکانی، بە چەشنێك کە هەموو گرێ کوێرەیەکی کردەوە و، بە شێوازێکیش کە هەموو کەسێك - لە هەر پلەیەکی تێگەیشتندا بێت - لێی تێدەگات و سوود و بەهرەی زۆری لێ وەردەگرێت.

بەم جۆرە، "پەیامەکانی نوور" توانییان لە سەرانسەری تورکیادا قوتابخانەیەکی ڕۆحی و زانستییانەی مەعنەویی ئەوتۆ بنیات بنێن کە ژیانی ئیمانداراانی ڕووناك کردەوە و، ڕزگاری کردن لە سەر لێ شێوان و، دوودڵی و، نەزانین و، هەموو جۆرەکانی شیرکی ئاشکرا و پەنهان..

ئیتر ژیری و دڵ و دەروونەکان بەو ڕێنماییانە خاوێن بوونەوە و، ڕووناکی ڕووی تێکردن و، دڵنیایی دایگرتنەوە.

ئەم پەیامانە تیشکی بەتینی یەکتاپەرستییان خستەکار و شەختە سەهۆڵی ئەو چەشنە بیر و بۆچوونە کۆمەڵایەتی و زانستی و ڕەوشتییانەی ماددییەتیان پێ تواندەوە، کە لەوەدا بوو ئەو کۆمەڵە باوەڕدارە لە مێژووی شارستانێتیدا بکوژێنێتەوە و ناوی لەسەر لاپەڕەکانی مێژوودا هەڵبگرێت.

مامۆستا نوورسی بە هەوڵ و تەقالاکانی ئەوەی سەلماند کە قورئانی پیرۆز مامۆستای سەرجەمی گەردوون و بوونەوەرانە، بۆ ئەوەی بگاتە ئەو دەرەنجامەی کە قوتابیانی قورئان مامۆستای هەموو جیهانن لە: بیروباوەڕی ڕاست و، شەریعەت و یاسای پڕ لە دانست و، ڕۆحییەتی بەرز و، ڕەوشتی ڕێك و پەسەندی نەخشەکێشراوی خواییدا. تاکو قوتابیانی قورئان متمانە و

---

(١) واتە مامۆستا نوورسی بۆ مەبەستی سەلماندنی ڕاستیەکانی ئیمان، تەنها بە "بەڵگەی نەقلی" ڕانەوەستاوە، بەڵکو ئەو بەڵگە عەقڵییانەشی بەکارهێناوە کە مرۆڤی هاوچەرخ پێیان قایل دەبێ و، زامەکانی دەروونیان پێ چارەسەر دەکات.

باوەڕ بە خۆیان پەیدا بکەنەوە و، شانازی بەو مامۆستاییەی خۆیان بکەن و، نەبنە کۆیلەی کافران و شوێنکەوتەی ڕەوشتیان و، هیچ هەوڵێك نەتوانێت لە خشتەیان ببات.

بەم جۆرە "پەیامەکانی نوور" بوون بە چەند یاسایەکی کۆمەڵایەتیی ئەوتۆ کە ئیمان و ڕەسەنایەتی و سەربەخۆیی زاتیان لە کۆمەڵدا چەسپاند.

**ئەم کتێبە و چەند تایبەتکارییەکی پەیامەکان:**

ئێستاش ئەم کتێبەی کە لە بەردەستی خوێنەری بەڕێزدایە، بریتییە لە وتەکانی (یەکەم تا نۆهەم) لە کتێبی (وتەکان) کە لە (سی و سێ) وتە (پەیام) پێکهاتووە.

بەڵام پێش ئەوەی بڕۆینە ناو بابەتەکان و دەست بە خوێندنەوەی ئەم وتانە بکەین، بە پێویستی دەزانم هەندێ دیاردە ڕوون بکەینەوە کە لە زۆربەی پەیامەکانی نووردا دێنە بەرچاوی خوێنەری بەڕێز و، بوونەتە شەقڵی تایبەتیی ڕوخسار و ناوەرۆکی ئەم پەیامانە، کە بە تایبەتی لەم وتانەدا خوێنەر زۆر بە جوانی دەیانبینێت و هەستیان پێ دەکات.

یەکێك لەوانە بریتییە لە نموونە هێنانەوە (ضرب الأمثال)!

گومان لەوەدا نییە کە "نموونە هێنانەوە" ڕۆڵێکی یەکجار گرنگی هەیە لە ئاسانکردن و نزیکخستنەوە و جێگیر کردنی مەبەست لە زەینی مرۆڤدا، بە جۆرێك کە ئەو بابەتەی نموونەکەی بۆ هێنراوەتەوە، پاش لەیادچوون، تەنها یادکردنەوەی نموونەکەی سەروزیادە بۆ ئەوەی بابەتەکە بێتەوە یادی مرۆڤ. هەروەها لەم ڕێگایەوە نووسەر یان قسەکەر دەتوانێت لەگەڵ هەموو توێژێکی خوێندەوار و نەخوێندەواردا و، لەگەڵ هەر ئاستێکی زانستی و تێگەیشتندا بدوێت و مەبەستی خۆی پێ ڕابگەیەنێت.

هەر لەم پێناوەشدایە کە دەبینین قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر بێت - لە چەندین شوێندا نموونەیان هێناوەتەوە و، لەم ڕێگایەوە ڕاستی‌یە گرنگ و گەورەکانی ئیمانیان لە تێگەیشتنی مرۆڤەوە نزیك خستووەتەوە.

لەبەر ئەوەی "پەیامەکانی نوور"یش تەفسیری ڕاستی‌یەکانی قورئانی پیرۆزن، ئەوا بە جۆرێکی فراوان و لە زۆربەی بابەتەکانیان نموونەیان هێناوەتەوە. ئەمەش لە ڕادەیەکی ئەوتۆدایە کە دەتوانرێت بوترێ: "نموونە هێنانەوە" تایبەتکاری‌یەکی بەرجەستەی پەیامەکانی نوورە.

بۆیە دەتوانین هۆکارێکی خوێندنەوەی بەردەوامی "پەیامەکانی نوور" و، ئەو بایەخە گەورەیەش کە لەو کاتەوە تا ئێستا بەم پەیامانە دراوە و دەدرێت لە لایەن توێژەکانی پیران و لاوان و ژنان و پیاوانەوە، بەوە لێك بدەینەوە. تەنانەت مامۆستا نوورسی خۆیشی بە هەمان جۆر ئەم دیاردەیەی لێك داوەتەوە کاتێ لێیان پرسیوە:

(بۆچی لە "وتەکان"دا - کە لە ڕێژنەی قورئانی پیرۆزەوە هەڵگۆزراون - هەست بە کاریگەری‌یەکی نائاسایی و لەعادەت بەدەری ئەوتۆ دەکەین کە مەگەر بە دەگمەن دەنا لە نووسینی خواناسان و تەفسیرنووساندا هەستی پێ ناکەین، چونکە ئەو کاریگەری‌یەی کە یەك دێڕی "وتەکان" دەیکات، بەرامبەر کاریگەریی یەك لاپەڕەی کتێبێکی ترە و.. ئەو هێزەش کە لاپەڕەیەکی دەیبەخشێت بە خوێنەر مەگەر لە کتێبێکی تەواوی تردا ئنجا دەست بکەوێت)[1]؟

---

(١) خوێنەر سەری لەوە سوور نامێنێ، چونکە خوێنەرانی ئەسڵە تورکی‌یەکەی ئەم پەیامانە دان بەم کاریگەری‌یەدا دەنێن، بەڵام وەرگێڕاوەکان با زۆر بە وردیش وەرگێڕرابن، هێشتا هەر چێژی ئەسڵەکەیان تێدا نابێ.

مامۆستاش وەڵامێکی جوان دەداتەوە و، دەڵێ:

(مادەم فەزڵی ئەم شتە بۆ ئیعجازی قورئان دەگەڕێتەوە نەك بۆ من، ئەوا بە بێ هیچ دوودڵییەك دەڵێم:

بەڵێ، بە ئەغلەب وایە. چونکە "وتەکان":

(تَصَوُّر) نییە بەڵکو (تَصديق)ە[1].. (ئیسلام) نییە بەڵکو (ئیمان)ە[2].. (معرفة) نییە بەڵکو (شهادة) و (شهود)ە[3].. (تقليد) نییە بەڵکو (تحقيق)ە[4].. (إلتزام) نییە بەڵکو (إذعان)ە[5].. (تصوف) نییە بەڵکو (حقيقة)ە.. (إدعاء) نییە بەڵکو (بەڵگە)یە لە دووتوێی (دەعوا)دا.

حیکمەتی ئەم نهێنییەش لەوەدایە کە:

بناغە و بنچینەکانی ئیمان لە سەردەمەکانی پێشوودا تابڵێی دامەزراو بووە و لە لایەن ئیماندارانەوە گوێڕایەڵییەکی تەواویان بۆ کراوە، بە ڕادەیەك کە ئەگەر عارفان و شارەزایان لە مەسەلە فەرعییەکاندا بەڵگەشیان نەهێنابایەتەوە، هەر تەنها ڕوونکردنەوەکانیان سەروزیاد بوون بۆ دروستکردنی قەناعەتی هاوچەرخانی خۆیان.

---

(١) تەصەوور: بریتییە لە پێزانینی شتێك، ئیتر بێ ئەوەی بە "ئەرێ" یان "نەرێ" حوکمی بەسەردا بدرێت. بەڵام "تەصدیق": بریتییە لەوەی کە بە ویستی خۆت ڕاستی(صدق) نیسبەت بدەی بۆ لای قسەکەر.

(٢) ئیسلام و ئیمان: لێرەدا مەبەست ئەو جیاوازییەیە کە لەم ئایەتەدا باس کراوە: ﴿قالت الأعراب آمنا قل لم تؤمنوا ولكن قولوا أسلمنا﴾(الحجرات:١٤).

(٣) مەعریفە: واتە پێزانینی شتێك بەو جۆرەی کە هەیە. مەبەست ناسینی خوای گەورەیە "شەهادە": گێڕانەوەی شتێك یان ڕووداوێك پاش دیتن بە چاو. "شهود": لێرەدا مەبەست بینینی خوای گەورەیە بە چاوی دڵ لە حەقیقەتدا.

(٤) تەقلید: چاولێکەری. "تەحقیق": گەیشتن بە ئەنجام پاش لێکۆڵینەوە.

(٥) ئیلتیزام: پابەند بوون. ئیزعان: جەزمکردنی عەزمە پاش دوودڵی.

تێبینی: بۆ واتای ئەم زاراوانە سوود لە کتێبی "التعريفات"ی "جورجانی" وەرگیراوە. (وەرگێڕ)

بەڵام لـه كـاتی ئێستاماندا، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی گومڕایـی زانسـتی (واتـه ئـه‌و گومڕاییـه‌ی كـه بـه نـاوی زانسـته‌وه خـه‌ڵكی لـه ڕێ ده‌ترازێنێـت) پـه‌لی بـۆ بناغه‌كانی ئیمانیش هاویشتووه، ئه‌وا خوای گـه‌وره و میـهره‌بان كـه ده‌رمـانی هـه‌موو ده‌ردێـك ده‌به‌خشێت، بـه دانـایی و میـهره‌بانیی خـۆی پرشنگێكی لـه "نموونه هێنانه‌وه" پێ به‌خشیوم، كه ڕوونترین و دره‌خشانترینی موعجیزه‌كـانی قورئانـه. ئه‌مـه‌ش ته‌نـها بـه‌زه‌یی خـواوه‌نـدی میهره‌بانـه كـه نـاردی بـه هانـای لاوازی و ناچاری و هه‌ژاریمه‌وه له نووسینه‌كانمدا، كه تایبه‌تن به خزمه‌تكردنی قورئـانی پیرۆز. كه‌واتـه ته‌نـها سـوپاس و سـتایش هـه‌ر بـۆ ئـه‌و خواوه‌نـده میهره‌بانه‌یه كه:

به دووربینی "نموونه هێنانه‌وه" دوورترین حه‌قیقه‌ت له پێش چاودا یه‌كجار نزیك خرایه‌وه و..

به‌هۆی یه‌كێتیی بابه‌تیش له "نموونه هێنانـه‌وه"دا زۆربـه‌ی مه‌سـه‌له پـه‌رش و بڵاوه‌كان كۆكرانه‌وه و..

بـه پلیكانـه‌ی "نموونـه هێنانـه‌وه" زۆر بـه ئاسـانی سـه‌ركه‌وتن بۆ بـه‌رزترین حه‌قیقه‌ت به‌ده‌ست هات و..

له ده‌روازه‌ی "نموونه هێنانه‌وه"شه‌وه دڵنیـایی ئیمـان به‌رامبـه‌ر بـه حه‌قیقه‌تـه په‌نهانه‌كانی غه‌یب و بناغه‌كانی ئیسلام به ئه‌ندازه‌یه‌ك هاته‌دی كه ده‌توانم بڵێم زۆر له "شهوود"ه‌وه نزیكه.

ئیتر هه‌روه‌ك لـه‌م ڕێیـه‌وه "زیـری" و "ئه‌ندێشـه" و "وه‌هـم" و "ده‌روون" و ئاره‌زووه‌كـانی ته‌سـلیم بـوون، بـه هـه‌مان جـۆر "شـه‌یتان"یـش چه‌كی دانــا و توانای به‌رگریی نه‌ما!

بە پوختی:

هەرچی کاریگەری لە نووسینەکانمدا دەردەکەوێت، هیچی هی من نییە و لە بیری منەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو لە دەرەنجامەکانی "نموونە هێنانەوە"یە کە بە ئاسمانی قورئانی پیرۆزەوە دەدرەوشێتەوە. بەشی من لەم کارەدا تەنها ئەوەیە کە لەوپەڕی پێویستی و بێ دەستەڵاتیدا هانا دەبەمە بەر خواوەند و لێی دەپاڕێمەوە..

کەواتە دەردەکە لە منەوەیە و دەرمانەکەشی لە قورئانی پیرۆزەوە)[1].

خوێنەری بەڕێز دەتوانێت دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبەی کە زیاتر پشتی بە "نموونە هێنانەوە" بەستووە، بۆی دەربکەوێ کە ئەم شێوازە لە نووسیندا چ ڕۆڵێکی هەیە لە ئاسانکردن و تێگەیاندنی مەبەست و نزیك خستنەوەی شتی دووردا.

ئەم لایەنەش کە لەم پەیامانەدا هەیە، یەکێکە لەو لایەنانەی کە "پەیامەکانی نوور" نزیك دەخاتەوە لە مەسنەویی "مەولانای ڕۆمی". چونکە مەسنەویی مەولاناش هەمان ڕێبازی چیرۆك و نموونە هێنانەوەی گرتووەتە بەر بۆ چارەسەرکردنی ئەو بابەتانەی لێیان دواوە.

* * *

لایەنێکی تری ئەم کتێبە و تێکڕای "پەیامەکان" ئەوەیە کە هەرکەسێ بە نیازێکی خاوێن و بە مەبەستی سوود وەرگرتن هەرکام لەم پەیامانە دەخوێنێتەوە، هەست دەکات ئەو پەیامە ڕۆڵی کاریگەری خۆی لە دڵ و دەرووندا بینیوە و، زۆر بە ئەسپایی چارەسەری مەعنەویی بۆ زامەکانی دڵ و

(١) بڕوانە: (مەکتووبات) لاپەڕە: ٦٣٦-٦٣٨

دەروونی ئەو خوێنەرە پێشکەش کردووە. ئیتر لەوانەیە خوێنەر سەری سوور بمێنێت و بپرسێ: ئایا دەبێ چ نهێنییەك لەم دیاردەیەدا هەبێت؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە پێویستە بزانین کە مامۆستا نوورسی هەمیشە دووپاتی دەکردەوە کە پەیامەکان موڵکی ئەو نین، بەڵکو بەخششێکی سۆز و میهرەبانیی خوای گەورەن. چونکە بەشی ئەو لە دانانی پەیامەکاندا تەنها ئەوە بوو کە لە بەردەم ئایەتەکاندا ڕادەوەستا و، بە نزا و لالانەوەی بەکوڵ لە دەرگانەی خواوەند دەپاڕایەوە کە یارمەتیی بدات و دەرگای لێ بکاتەوە. خۆ کاتێ کە دەرگای دڵی لە ڕووی ڕاستییەکانی ئەو ئایەتانەدا دەکرایەوە، یەکسەری و بێ دواکەوتن ئەو ڕاستییانەی دەوت و، قوتابیانیشی خێرا و بە پەلە دەیاننووسییەوە..

لەبەر ئەوە، زۆر جار جەختی دەکردەوە کە "پەیامەکانی نوور" موڵکی ئەو نین و، داوای دەکرد پەیوەست نەکرێن بەخۆیەوە.

ئەوەتا لەم دێڕانەی خوارەوەدا تەشبیهێکی جوان دەکات بۆ پیشاندانی پەیوەندیی خۆی لەگەڵ پەیامەکانی نووردا. دەفەرموێت:

(ئەو تایبەتکارییانەی لە هێشووی بەلەزەتی ترێدا هەن، وا مەزانە هی قەدی و شکی ئەو مێوەیە کە ئەو هێشووەی گرتووە. منیش وەکو ئەو قەدە و شکانەم سەبارەت بەو ترێ بەلەزەتانە)[1]!

(خۆ ئەگەر من دەنگم بە هەموو جێگایەکی جیهان بگەیشتایە، ئەوا بە هەرچی هێز و توانام هەیە دەموت:

"وتەکان" تێکڕا حەقیقەتن و تابلێی جوان و ڕەنگینن. بەڵام لە منەوە سەرچاوەیان نەگرتووە، بەڵکو چەند تیشکێکن لە ڕاستییەکانی قورئانی

(١) بڕوانە: (مەکتووبات) لاپەڕە: ٦٢٣

پیرۆزەوە پەیدا بوون و درەوشاونەتەوە. کەواتە جوانیی ڕاستییەکانی قورئان لە لایەن منەوە نیيە و مـن نەمڕازاندووەتەوە، تەنانەت هەر نەشمتوانیوە جوانییەکەی دەربخەم، بەڵکو ڕاستییە جوانەکانی قورئانی پیرۆز، وشە و دارشتنەکانی منیان ڕازاندووەتەوە.

من مەدح و ستایشی قورئانم بە وتەکانم نەکردووە.. بەڵکو وتەکانم بە ستایشی قورئان مەدح و سەنا کردووە)[1].

بۆیە دەبینین مامۆستا لەم وتانەدا و لە پەیامەکانی تردا یەك ئایەت یاخود چەند ئایەتێك دەکات بە دەسپێکی باسەکەی، پاشان وردە وردە و هەنگاو بە هەنگاو دەچێتە ناو مەبەستەوە، بە چەشنێك مرۆڤ پاش خوێندنەوەی کە تەماشای ئەو ئایەتانە دەکات چێژێکی تازە و جوان و جیهانێکی نوێیان تێدا بەدی دەکات.

* * *

لایەنێکی تر کە بە پێویستی بزانم لێرەدا باس بکرێت، ڕوونکردنەوەی: (جەمسەری بنەڕەتیی باسەکانی پەیامەکانی نوور)ە.

ئەم لایەنەش بە کورتی بەوە ڕوون دەبێتەوە کە:

مامۆستا نوورسی هەموو کۆششێکی لە پەیامەکاندا بە چڕی ئاراستەی "ڕاستییەکانی ئیمان" کردبوو، کە ئەمەش ئاسوودەیی بە (تاك) و بەختەوەری بە (کۆمەڵ) دەبەخشێت. بۆیە هیچ کاتێك ئەو ئامۆژگارییە کۆمەڵایەتییانەی پێشکەش نەکردووە کە هەرگیز ناگونجێن بێنەدی و لە واقیعی ژیاندا جێبەجێ بکرێن!

---

(١)بڕوانە: (مەکتووبات) لاپەڕە: ٦٢٤

له‌به‌ر ئه‌وه، په‌یامه‌کانی نوور هه‌ردەم سه‌رنجی خوێنه‌ریان بۆ ئه‌و بابه‌تانه ڕاکێشاوه که سه‌ره‌کی و بنه‌ڕه‌تین له ئایینی ئیسلامدا، ئه‌وانه‌ی که نه ڕه‌وتی زه‌مان و نه دۆزینه‌وه و داهێنانه زانستی‌یه‌کان ناتوانن بیانگۆڕن و کار بکه‌نه سه‌ریان. ئیتر له هه‌ر مه‌سه‌له‌یه‌ك دوابێتن له‌م گۆشه‌یه‌وه بۆیان ڕوانیوه و ڕوونیان کردووه‌ته‌وه، چ له‌باره‌ی بیروباوه‌ڕه‌وه، چ له بابه‌ته کۆمه‌لآیه‌تی‌یه‌کاندا بووبێت. چونکه ئیمان - وه‌ك مامۆستا نوورسی پێناسه‌ی ده‌کات - نوورێکه له باوه‌ڕکردنه‌وه په‌یدا ده‌بێت به بابه‌ته سه‌ره‌کی و بنه‌ڕه‌تی‌یه‌کانی ئیمان به درێژی، ئنجا بابه‌ته‌کانی تر به کورتی. له‌به‌ر ئه‌وه، به‌ردی بناغه‌ی ڕوونکردنه‌وه‌کانی "په‌یامه‌کانی نوور" بریتی‌یه له: (ڕاستی‌یه‌کانی ئیمان).

خوێنه‌ری به‌ڕێز!

ئه‌گه‌ر تایبه‌تمه‌ندی‌یه‌کانی "په‌یامه‌کانی نوور" به درێژی باس بکه‌ین زۆر ده‌خایه‌نێت و، له ڕاستیدا پێویستیی به باسێکی سه‌ربه‌خۆیه. له‌به‌ر ئه‌وه، لێره‌دا هه‌ر هێنده‌ی لی دواین، تاکو بڕۆینه ناو بابه‌ته‌کانی ئه‌م کتێبه و ده‌ست به خوێندنه‌وه‌ی ئه‌م وتانه بکه‌ین.

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

والحمد لله رب العالمين.

فارووق ڕه‌سوول یه‌حیا

١٤٠٤/١٢/٥ کۆچی

١٩٨٤/٨/٣١ زاینی

بسم الله الرحمن الرحیم

وبہ نستعین

الحمد للہ رب العالمین والصلوٰۃ والسلام علیٰ سیدنا محمد

وعلیٰ آلہ وصحبہ اجمعین

ئەی کاکی برا!

داوای هەندێ ئامۆژگاریت لێ کردبووم. وا چەند ڕاستییەکت پێشکەش دەکەم و، دەسا تۆیش لەگەڵ نەفسی منداـ کە لە هی هەموو کەسێك زیاتر پێویستی بە ئامۆژگارییە ـ گوێیان لێ ڕابگرە.

جا لەبەر ئەوەی تۆ لە سەربازیدایت، ئەوا ئەم ڕاستییانە لە ناوەندی چەند نموونەیەکی سەربازی و لە هەشت چیرۆکی کورتدا دەهێنمەوە کە کاتی خۆی هەشت وتەی دوور و درێژ بوون و، لە هەشت ئایەتی پیرۆزەوە وەرم گرتبوون و، ئاراستەی دەروونی خۆمم کردبوون. وا ئێستاش لەسەر زمانی زۆرینەی خەڵکی ئاراستەی دەروونی خۆمیان دەکەمەوە و، هەر کەسێکیش حەزیان پێ دەکات با لەگەڵ ئێمەدا گوێیان لێ ڕابگرێت.

# وته‌ی یه‌که‌م

بسم الله الرحمن الرحيم

"بسم الله..." سه‌ره‌تای هه‌موو کارێکی خێر و گرنگه‌، بۆیه‌ ئێمه‌ش له‌ سه‌ره‌تاوه‌ باسی ده‌که‌ین و به‌ "بسم الله" ده‌ست پێ ده‌که‌ین.

بزانه‌ ئه‌ی نه‌فسه‌که‌م!

ئه‌م وشه‌ پاراوه‌ پیرۆزه‌ هه‌روه‌ك دروشمی ئیسلامه‌، له‌ هه‌مان کاتدا زیکر و ویردی هه‌موو بوونه‌وه‌رانیشه‌ به‌ زمانی حاڵیان.

ئه‌گه‌ر ده‌ته‌وێت تێبگه‌یت که‌ چ هێزێکی گه‌وره‌ و بێ برانه‌وه‌ له‌م وشه‌یه‌دا هه‌یه‌ و، بزانیت چ به‌ره‌که‌تێکی مه‌زن ونه‌بڕاوه‌ی له‌خۆ گرتووه‌، ئه‌وا گوێ بۆ ئه‌م چیرۆکه‌ کورته‌ ڕابگره‌:

هه‌ر ده‌شته‌کی‌یه‌ك بیه‌وێت به‌ناو ده‌شت و ده‌ر و بیاباندا بگه‌ڕێت و به‌ ئازادی کاره‌کانی جێ‌به‌جێ بکات، ده‌بێ بۆ ئه‌م مه‌به‌سته‌ په‌نا به‌رێته‌ به‌ر هۆزێکی ئه‌و ناوچه‌یه‌ و ناوی سه‌رگه‌وره‌ی ئه‌و هۆزه‌ بزانێت و پشتیان پێ ببه‌ستێ، بۆ ئه‌وه‌ی له‌ زیانی چه‌ته‌ و شه‌ڕفرۆش و ڕێگران پارێزراو بێت و پێویستی‌یه‌کانی جێبه‌جێ بکات. خۆ ئه‌گه‌ر ئه‌م کاره‌ ئه‌نجام نه‌دات، ئه‌وا به‌ ته‌نها ده‌ست ده‌مێنێته‌وه‌ له‌ به‌رامبه‌ر چه‌نده‌ها دوژمن و هه‌زاران پێویستیی ژیاندا.

جارێکیان دوو کەس بەرەو گەشتێکی وا کە باسمان کرد کەوتنە ڕێ. یەکێکیان مرۆڤێکی لەخۆبوردە بوو، بەڵام ئەوی دیکەیان سەرکەش و لەخۆبایی بوو.

یەکەمیان پەنای بردە بەر سەرۆك هۆزێك.. بەڵام دووهەمیان ئەمەی نەکرد و گوێی پێ نەدا..

ئیتر هەر یەکەیان بە لایەکدا ڕۆشتن.

یەکەمیان کە دەگەیشتە هەر جێیەك و دانیشتوانی ئەو ناوچەیە کە دەیانزانی سەر بەو هۆزەیە، ڕێزێکی زۆریان لێ دەگرت و بۆ خۆی دەحەسایەوە، خۆ ئەگەر یەکێکی چەتە و ڕێگری پێ بگەیشتایە، ئەوا دەستەڵات و هێزی ئەو خێڵە دەبوو بەهۆی ئەوەی دەست نەخرێتە ڕێی. بەم شێوەیە و بەوپەڕی ئازادی و نەترسانەوە گەشتی خۆی تەواو کرد و کارەکانی بەجێ هێنا.

بەڵام کابرای سەرکەش و یاخی، ئەوەندە ناخۆشیی تووش بوو کە لە باس کردن نایەت. بە درێژایی گەشتەکەی لە ترس و بیم و خەفەت و سوالکردندا بوو. بەو جۆرە، خۆی زەلیل و ڕسوا کرد.

ئەی نەفسی سەرکەشی یاخیبووم!

چاك بزانە کە تۆ ئەو ڕێبوارەیت..

ئەو بیابانە پڕ لە مەترسییەش ئەم دنیایەیە..

هەروەها باش بزانە کە "هەژاری" و "بێ دەستەڵاتی"ی تۆ سنووریان نییە و، دوژمنەکانت تابڵێی زۆرن و پێویستییەکانی ژیانیشت لەبن نایەن.

کەواتە پەنا بەرە بۆ خاوەنی ڕاستەقینە و کاربەدەستی هەتاهەتایی ئەم دەشت و بیابانە، بۆ ئەوەی دوور بیت لە سەرشۆڕی و پاڕانەوە بەرامبەر بوونەوەران و، ترست لە هیچ ڕووداوێکی سامناك نەبێت لە ڕێگاتدا.

بەڵێ، وتەی "بسم الله" گەنجینەیەکی گەورەی وایە کە "هەژاری" و "بێ دەسەڵاتی"ی مرۆڤ بە میهرەبانی‌یەکی گەورە و دەسەڵاتێکی هێندە نەبڕاوە و بێ کۆتاییەوە پەیوەست دەکات کە جڵەوی بوونەوەرانی هەر لە گەردیلەکانەوە تا گەلەستێرەکان لە دەستدایە. بە شێوەیەك کە ئەو "هەژاری" و "بێ دەسەڵاتی"یەی مرۆڤ دەگەیەنێتە پلەیەك کە دەبن بە تکاکار و، نزا و پاڕانەوەیان لە دەرگانەی خواوەندی بە دەسەڵات و میهرەبان و شکۆمەندا گیرا دەکات.

بەڵێ، هەر کەسێ هەڵسوکەوت و کاروباری شەو و ڕۆژی "بە ناوی خوا"وە ببات بەڕێوە، وەکو سەربازێك وایە کە هەموو کاروبار و هەڵسوکەوتێکی بە ناوی یاسا و دەوڵەتەوە ئەنجام بدات و بەو هۆیەوە بەرەوڕووی هەموو مەترسی‌یەك ڕابووەستێت، چونکە بە ناوی یاسا و دەوڵەتەوە دەدوێت و کارەکانی ئەنجام دەدات.

لە سەرەتاوە وتمان: هەموو بوونەوەران بە زمانی حاڵیان دەڵێن "بسم الله". ئایا ڕاستە وایە؟

بەڵێ، گومانی تێدا نی‌یە کە ئەگەر تۆ کەسێکت بینی خەڵکی دەدایەبەر و دەیبردن بۆ مەیدانێك و هەندێ کاروباری جۆراوجۆری پێ جێبەجێ دەکردن، یەکسەر بۆت ڕوون دەبێتەوە کە ئەو کەسە بە ناوی خۆیەوە ئەم کارانە ناکات و توانای زۆر کردنی لەو هەموو خەڵکە نی‌یە، بەڵکو سەرباز و فەرمانبەرێکی دەوڵەتە و، بەهۆی هێز و دەسەڵاتی دەوڵەت و بە ناوی یاساوە ئەو کارانە جێبەجێ دەکات و، پشت بە پادشا و فەرمانڕەوایەك دەبەستێت.

هەروەها هەموو شتێك لەم بوونەوەرەدا کارەکانیان "بە ناوی خوا"وە جێبەجێ دەکەن، تەنانەت بچووکترین تۆوی درەخت، بە "ناوی خوا"وە چەندەها درەختی گەورە و کۆڵی قورس لەسەر سەریان هەڵدەگرن..

هەروەها هەر درەختێك کە "نـاوی خـوا" دەبـات، دەستەکانی لـە میـوەی زۆر و ڕازاوەی گەنجینەی بـەزەیی و میـهرەبانیی خـوای گـەورە پـڕ دەبێـت و، بەوپەڕی ئاسایی و ڕێزەوە پێشکەشمانی دەکات..

هەروەها ڕەز و باخ و بێستانەکانیش کە "ناوی خـوا" دەبـەن و پـەنا دەبەنـە بـەر دەستەڵاتی بێ سنوور و نەبڕاوەی خـوای گـەورە، ئـەوا خواردەمـەنیی جۆراوجۆر و بەتام و لەزەتیان تێدا پێدەگات..

هـەروەها ئـەو ئاژەڵـە بـەپیت و پڕ سـوودانەی وەك بـزن و مـەڕ و مانگـا و حوشـتر، هـەر یەکـەیان کـە "نـاوی خـوا" دەبـات، گوانـی دەبێتـە کانییـەك و شیری لـێ هەڵدەقوڵێت. بـەم چەشـنە و بـە "نـاوی ڕۆزیـدەر"ەوە خاوێنـترین و باشترین خۆراکمان پێشکەش دەکات..

هەروەها ڕەگ و بنەچەی هەر ڕووەك و درەخـت و گیایـەك بـە "ناوهێنـانی خـوا" بـەردی ڕەق و تـەق دەسمێـت و بـە تاڵـە مـووە ئاوریشـمییەکانی کونـی دەکات! بەم جۆرە و "بە ناوی خوای میهرەبان"ەوە هەموو کارێکی گرنگ و هەموو شتێکی گرانی لە ڕێدا بۆ ئاسان دەبێت.

بەڵێ، کاتێ کـە درەخـت لـق و پەلـەکانی لـەناو هـەوادا بـڵاو دەکاتـەوە و بەروبوومـەکانیان لەسـەر هـەڵدەگرێت.. کاتێ جێـی لـق و پـەلی ڕەگــەکانی لەناو بەردی ڕەق و تەقدا دەکاتەوە تاکو ئەو ڕەگانە خۆراکـی پڕسـوود لـەناو چینـەکانی زەویـدا کـۆ بکەنـەوە.. کاتێ گـەڵای تـەڕی درەخـت دەتوانێـت بەرامبەر گڕەی گەرما خۆی ڕابگرێت و بمێنێتەوە..

هـەموو ئەمانـە و جۆرەهـای تـری وەك ئەمانـەش، زللـەیەکی تونـد و تیـژن بەسەر دەموپلی ماددییە هۆپەرستەکان و، هـاوارێکی گـەورەیە لـە دژیـان و، پەنجە بە چاویاندا دەکات و دەڵێت: ڕەقیی ئـەو بەردانـە و گـڕەی بـەهێزی ئـەو گەرمایە بە سـەربەخۆیی و ئـارەزووی خۆیـان کـار ناکـەن، بـەڵکو هـەموویان

فەرمانی خوایەکی تەنیای دانا و زانا جێبەجێ دەکەن، بە شێوەیەك ڕەگە وردە ئاوریشمییەکان وەك: "عەسای مووسا" بەردە ڕەقەکان لەت دەکەن و فەرمانی: ﴿فَقُلْنا اضْرِبْ بعصاكَ الْحَجَــرَ﴾ (البقرة:٦٠) جێبەجێ دەکەن.. هەروەها گەڵای تەڕی درەختەکانیش وەکو ئەندامەکانی ئیبراهیم پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر بێت - ئایەتی: ﴿يا نارُ كُونِـي بَــرْداً وسَــلاماً﴾ (الأنبياء:٦٩) دەخوێنن!

جا لەبەر ئەوەی کە هەموو شتێك لە بوونەوەردا بە زمانی حاڵ دەڵێت: "بسم الله" و، ئەمەشی بۆ دەبێت بەهۆی دەستکەوتنی جۆرەها نیعمەت و پێشکەش کردنی بە بوونەوەرانی تر، ئەوا دەبێ ئێمەش هەموو کارێکمان "بە ناوی خوا"وە بێت:

بەخشینمان "بە ناوی خوا"وە بێت..

وەرگرتنمان "بە ناوی خوا"وە بێت..

هەروەها "بە ناوی خوا"وە دەستی لەخوا بێ ئاگایان بگێڕینە دواوە و لێیان وەرنەگرین کاتێ کە "بە ناوی خوا"وە شتان نابەخشن!

**پرسیار:**

هەر کەسێك کە دەبێت بە هۆکاری ئەوەی نیعمەتێکمان دەست بکەوێت، هەردەم لە پاداشتیدا ڕێزی لێ دەگرین. ئەی ئایا خاوەنی ڕاستەقینەی ئەم هەموو نیعمەت و ڕۆزییە زۆرانە چیمان لێ داوا دەکات؟

**وەڵام:**

ئەو نیعمەت بەخشە ڕاستەقینەیە لە بەرامبەر ئەم هەموو جۆرە نیعمەت و ڕۆزییە زۆرانەوە، داوای سێ شتمان لێ دەکات:

یەکەم: یاد و ناوی خوا بردن (الذکر).. دووهەم: شوکر و ستایش (الشکر).. سێهەم: بیرکردنەوە لە گەورەیی ئەو خوایە (الفکر)..

كه له سه‌ره‌تاوه "بسم الله" ده‌كه‌ين، ئه‌مه "زيكر"ه..

كه له كۆتاييدا "الحمدلله" ده‌كه‌ين، ئه‌مه "شوكر"ه..

كه له نێوان "بسم الله" و "الحمد لله"شدا بير له ده‌سته‌ڵات و موعجيزه‌ى خواى ميهره‌بان ده‌كه‌ينه‌وه له‌و نيعمه‌تانه‌ى كه هه‌ر يه‌كه‌يان موعجيزه‌يه‌كى توانستى خواى تاك و بێ وێنه‌يه و، ديارى‌يه‌كه له دياری‌يه‌كانى ميهره‌بانيى فراوانى ئه‌و خوايه.. كاتێ بير له‌مانه ده‌كه‌ينه‌وه، ئه‌مه "فيكر"ه.

به‌ڵام ئايا ئه‌و كه‌سه‌ى كه دياری‌يه‌كى پادشاى به سه‌ربازێكيدا بۆ هاتووه چه‌نده به بێ عه‌قڵ و نه‌فام داده‌نرێت گه‌ر له بريى سوپاسى پادشا، پێڵاوى ئه‌و سه‌ربازه ماچ بكات؟

ئايا ئه‌و كه‌سه‌ى كه هه‌ميشه له شان و باڵى "هۆكاره‌كان" ده‌خوێنێت و ته‌نها ئه‌و هۆكارانه‌ى خۆش ده‌وێت، نه‌ك نيعمه‌تده‌ر و ڕۆزى به‌خشى ڕاسته‌قينه، هه‌زار هێنده‌ى ئه‌و كابرايه گه‌وج و گه‌لحۆتر نى‌يه؟!

ده‌سا ئه‌ى نه‌فسه‌كه‌م!

ئه‌گه‌ر ئاماده نييت و ناته‌وێ وه‌ك ئه‌و مرۆڤه گێل و گه‌لحۆيه بيت..

ئه‌وا:

"به ناوى خوا"وه ببه‌خشه..

"به ناوى خوا"وه وه‌ربگره..

"به ناوى خوا"وه ده‌ست به هه‌موو كارێك بكه..

"به ناوى خوا"وه كاره‌كانت به‌جێ بهێنه.

والسلام.

# وتەی دووهەم

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿الّذين يؤمِنونَ بالغَيبِ﴾ (البقرة:٣)

ئەگەر دەتەوێت بزانیت "ئیمان" تا چ ڕادەیەك بەختیاری و نیعمەتێکی گەورەیە و، تاچ ئەندازەیەکیش لەزەت و حەسانەوە بە مرۆڤ دەبەخشێت، ئەوا گوێ بۆ ئەم کورتە چیرۆکە ڕابگرە:

ڕۆژێکیان دوو پیاو بە مەبەستی حەوانەوە و بازرگانی پێکەوە ڕۆشتن بۆ گەشتێك..

یەکێکیان - کە مرۆڤێکی خۆپەرست و بەدبەخت بوو - ڕووی کردە لایەك و.. ئەوی تریشیان - کە مرۆڤێکی خواپەرست و بەختەوەر بوو - ڕووی کردە لایەکی تر..

بەم جۆرە، هەریەکەیان ڕێی خۆی گرتەبەر.

خۆپەرستە لە خۆباییەکەیان کە مرۆڤێکی ڕەشبین بوو، لە سزای ڕەشبینی‌یەکەیدا دووچاری وڵاتێك بوو کە لە بەرچاویدا لە ڕادە بەدەر خراپ و شووم بوو؛ ڕووی دەکردە هەر گۆشە و قوژبنێك مرۆڤی بێچارە و بێ دەستەڵاتی دەبینی کە هاواریان دەکرد و لە دەست کەسانی دڵڕەق و بێ

بەزەیی و کارە ڕووخێنەرەکانیان دەیانناڵاند.. دەرۆشتە هەر جێگایەك خەم و پەژارەی بەرچاو دەکەوت، بە ڕادەیەك ئەو وڵاتە لە پێش چاویدا شێوەی ماتەمینگایەکی گشتیی وەرگرتبوو!

جا بۆ ئەوەی ئەم مەینەتی‌یەی کەم بکاتەوە و لە بیری خۆی بەرێتەوە، هیچ چارەیەکی نەدۆزی‌یەوە جگە لە خۆ مەستکردن. چونکە وا گومانی دەبرد کە هەموو دانیشتووانی ئەم وڵاتە دوژمنایەتیی دەکەن و ڕقیان لێیەتی و سەبارەت بەم کەسانێکی نامۆن. ئەوەش کە زیاتر بوو بە مایەی ئەوەی ویژدانی ئەم مرۆڤە لە ئازاردا بتلێتەوە ئەوە بوو کە بە هەر لایەکدا دەیڕوانی و سەیری دەوروبەری خۆی دەکرد، چەندین تەرمی سامناکی دەهاتە پێش چاو، هەروەك گوێی لە دەنگی ناڵە و شیوەنی هەتیوان دەبوو کە بە نائومێدی‌یەوە دەگریان.

بەڵام ئەوی تریان کە خواپەرست و عەوداڵی حەق و ڕاستی و خاوەنی ڕەوشتی بەرز و پەسەند بوو، تووشی وڵاتێك بوو کە لە پێش چاویدا خۆش و دڵڕفێن بوو..

هەر کە گەیشتە ئەوێ بینیی وا ئاهەنگ و شادی ساز کراوە و، لە هەموو لایەکەوە شادمانی‌یە و لە هەر گۆشەیەکدا خۆشی‌یە و لە هەر جێگایەکدا میحرابی زیکرە، بە ئەندازەیەکی ئەوتۆ دڵی بەم دیمەنانە گەشایەوە کە هەموو دانیشتووانی وڵاتی بە دۆست و هاوڕێی دڵسۆز و خزمی خۆشەویست دەهاتە پێش چاو. پاشان دەیبینی کە سەرانسەری وڵات لە ئاهەنگی پشوودانداشوکر و سوپاس و شادمانی و بەختەوەریی خۆیانیان ڕادەگەیاند و، گوێی لە ئاهەنگی تیپی مۆسیقا بوو کە بە ئاوازی پڕ لە جۆش و حەماسەتەوە خەڵکی دەخرۆشاند و هەڵی دەنان کە بە تەکبیر و تەهلیلەوە بەرەو جیهاد و خزمەتگوزاری بڕۆن.

لە کاتێکدا کە بەدبەختەکەیان بە پەژارەی خۆی و ئازاری خەڵکییەوە دەتلایەوە، کەچی ئەم بەختەوەرە بە شادمانیی خەڵکی دڵخۆش و شادمان بوو. سەرەڕای ئەمەش بازرگانییەکی بەپیت و بەرەکەتی کرد و شوکرانەی خوای میهرەبانیشی بەجێ هێنا.

لە گەڕانەوەیدا هاوڕێکەی بینی و هەواڵی لێ پرسی. کە لە وەڵامی هاوڕێکەیەوە هەموو شتێکی بۆ دەرکەوت، ڕووی تێ کرد و پێی وت:

- (برام! تۆ دەڵێیت چی؟ ئایا شێت بوویت و ژیریت لە دەست داوە؟! تەنها ئەنجامی ڕەنگدانەوەی ڕەشبینیی دەروونتە کە لە ڕواڵەتدا بەرجەستە بووە و، هەموو خەندەیەك بە شیوەن دێتە بەرچاوت و، هەر پشوودان و مۆڵەتێکیش بە تاڵان و برین دەزانیت! وەرەوە سەر هۆشی خۆت و دڵت لە هەموو ژەنگێك پاك بکەرەوە، تاکو ئەم پەردە تاریکەی سەر چاوانت لابچێت و بە ڕوونی ڕاستی ببینیت. ئەوەش بزانە کە پادشا و خاوەنی ئەم وڵاتە لەوپەڕی پلەی دادپەروەری و بەخشندەیی و توانا و پەروەردگاری و بەزەییدایە.. جا وڵاتێك بەم چەشنە لە بەرزی و پەرەسەندندا بێت - کە شوێنەواری ئەمانەش بە ئاشکرا دەبینرێن - هەرگیز بەو جۆرە نابێت کە وەهم و ئەندێشەی تۆ پیشانی دەدات)!

برادەرەکەشی کە ئەمانەی لێ بیست و وردە وردە هۆش و بیری خۆی خستەکار و هاتەوە سەر خۆی. بە پەشیمانییەوە وتی:

- بەڵێ ڕاستە، بەهۆی سەروسەودای زۆرم لەگەڵ مەیدا تێك چووبووم. خوا لێت ڕازی بێت، لە بارێکی پەرێشانی دۆزەخ ئاسادا بووم، ڕزگارت کردم.

* * *

ئه‌ی نه‌فسه‌كه‌م!

باش بزانه كه پیاوی یه‌كه‌م: مرۆڤی "كـافر" یـاخود "فاسق"ی لـه خـوا بێ ئاگایـه. ئـه‌م دنیایـه لـه ڕوانگـه‌ی بینینـی ئـه‌ودا ماته‌مینگایـه‌كی گشـتی‌یه و، سه‌رجه‌می زینده‌وه‌رانیش وه‌كو هـه‌تیو وان و، هه‌میشـه لـه ده‌ست جودایی و لێكدابڕان له ناڵه و گریاندان..

له‌م ڕوانگه‌یه‌وه ئاده‌میزاد و گشت زینده‌وه‌ران بێ خاوه‌ن دێنه بـه‌رچاو و، به نینۆكی ئه‌جه‌ل شـپرزه و لـه‌ت لـه‌ت ده‌كرێـن و، چیـا و ده‌ریـا و بوونـه‌وه‌ره مه‌زنه‌كانی تریش وه‌ك ته‌رمی ترسناكی بێ گیان و هه‌ست ده‌رده‌كه‌ون.

ئه‌م جۆره كوفر و گومڕاییانه‌ی كـه مـرۆڤ ده‌توێننـه‌وه، چـه‌ندین پـه‌ژاره و سه‌رسـامییان لـێ پـه‌یدا ده‌بێـت و، ئـازارێكی تـاڵی مه‌عنـه‌ویش ده‌رخـواردی خاوه‌نه‌كه‌یان ده‌ده‌ن.

پیـاوی دووهـه‌میش: مرۆڤـی "بـاوه‌ڕدار"ه، كـه به‌دیهێنـه‌ر و خـوای خـۆی ده‌ناسێت و بـاوه‌ڕی پێ‌یـه‌تی. ئیـتر "دنیـا" لـه ڕوانینـی ئـه‌ودا بریتی‌یـه لـه: زیكـرگایه‌كی خـوایی و، گـۆڕه‌پانی مه‌شـق و فێركـردن بـۆ مـرۆڤ و زینده‌وه‌ران و، كۆڕی تاقیكردنه‌وه‌ی "جینی" و "ئاده‌میزاد"ه..

مردنی مـرۆڤ و زینـده‌وه‌ران لـه‌و گۆشه نیگایـه‌وه بریتی‌یـه لـه پشـوودانی پاش تـه‌واو كردنی ئـه‌ركی ژیـان. ئـه‌و باوه‌ڕدارانـه‌ی كـه ئـه‌ركی سه‌رشـانیان كۆتـایی پـێ هێنـاوه، شـادمانن بـه ماڵئـاوایی كردنیـان لـه‌م دنیـا فانی‌یـه و گواستنه‌وه‌یان بۆ جیهانێكی تری پڕ له ئارامی و هێمنی، تاكو ده‌رفه‌ت و ماوه فـراوان و ئامـاده بێـت بـۆ كارمـه‌ندانی نـوێ كه ئـه‌ركی خۆیـان وه‌ربگـرن و ئه‌وانیش هه‌وڵی خۆیانی تێدا بده‌ن..

له‌م ڕوانگه‌یه‌وه، هاتنه دنیای ئـاده‌میزاد و زینـده‌وه‌ران بریتی‌یـه لـه: ڕه‌وانـه كردنیان بۆ سه‌ربازی و چه‌ك وه‌رگرتن و خزمه‌تگوزاری. چونكه زینده‌وه‌ران

سەربازی شادمان و دڵخۆشن و، فەرمانبەری ڕێکوپێك و شوكرانەبژێری خواوەندن.

ئەو دەنگ و زایەڵانەش كە لە هەموو گۆشە و كەنارێكی دنیاوە دێنە گوێ، یان زیكر و تەسبیحی وەرگرتنی ئەرك و فەرمانن، یا شوكر و ستایشی تەواو كردنی ئەو ئەرك و فەرمانانەیە كە پێیان سپێرراون، یاخود ئاوازێكە لە شەوق و شادمانیی كاركردندا بەرز دەبێتەوە.

كەواتە بوونەوەران، لە ڕوانگەی بینینی ئەم مرۆڤە باوەڕدارەوە، بریتین لە: خزمەتگوزاری دڵدەرەوە و، فەرمانبەری هاوڕێ و، پەڕاو و پەرتووكی شیرین و خۆشی خاوەنە بەخشندە و میهرەبانەكەیان.

بەم جۆرە، زۆر لەم چەشنە ڕاستی‌یە بەرز و شیرین و بەتام و چێژانە لە "ئیمان"ی ئەو ئیماندارەدا دەردەكەون و دەدرەوشێنەوە.

كەواتە لە ڕاستیدا "ئیمان" تۆوی مەعنەویی "تووبای بەهەشت" لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت و.. "كوفر"یش تۆوی مەعنەویی "زەقوومی دۆزەخ" لە خۆیدا دەشارێتەوە.

كەواتە، ئاسایش و سەرفرازی تەنها لە ئیسلام و ئیماندایە.

لەبەر ئەوە، پێویستە هەمیشە پڕ بە دەم بڵێین:

"الحمدُ للهِ على دينِ الإسلامِ و كمالِ الإيمان".

# وتەی سێهەم

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿يا أَيُّهاَ الناسُ اعْبُدُوا﴾ (البقرة:٢١)

ئەگەر دەتەوێت بزانیت کە "خواپەرستی" چەندە بەختیاری و بازرگانی‌یەکی گەورە و گرنگە و، خراپکاری و گومڕاییش چەندە زەرەر و زیانێکی گەورەی تێدایە، ئەوا سەیری ئەم چیرۆکە بکە و گوێی بۆ ڕابگرە:

جارێکیان دوو سەرباز فەرمانیان پێ درا کە بڕۆن بۆ شارێکی دوور. ئەوانیش پێکەوە کەوتنەڕێ هەتا گەیشتنە دووڕیانێك. لەوێدا پیاوێکیان دی، ئەم پیاوە پێی وتن:

(ڕێگای دەستە ڕاستیان سەرەڕای ئەوەی بێ زیانە، ئەوانەش کە دەیگرنە بەر بە ڕێژەی "نۆ لە دە" قازانجیان دەست دەکەوێت و بە ئارامی و بێ ماندووبوونیش دەیبڕن تا دەگەنە جێ. بەڵام ڕێگای دەستە چەپیان سەرەڕای ئەوەی هیچ دەسکەوتێکی تێدا نی‌یە، "نۆ لە دە"ی ئەوانەش کە دەیگرنەبەر تووشی زەرەر و زیان دێن.. ئەوەش بزانن کە هەردوو ڕێگاکە بە ئەندازەی یەك دوورن، ئەوەندە هەیە ڕێگای دەستە چەپ، لەبەر ئەوەی پەیوەستی هیچ ڕژێم و یاسا و حکوومەتێك نی‌یە، ئەو ڕێبوارەی پیایدا دەڕوات چەك و تفاق لەگەڵ خۆیدا هەڵناگرێت و، بەم پێیە سووکی و حەسانەوەیەکی ڕواڵەتیی تێدا دەبینێت. بەڵام ڕێگای دەستە ڕاست، لەبەر ئەوەی لە ژێر سایەی یاسادایە، ئەوا ئەو ڕێبوارەی کە بە سەربازی دەیگرێتەبەر ناچارە چەکێکی

ڕەسمی بە قورسیی دوو کیلۆ کیلۆ لەگەڵ خۆی هەڵبگرێت و، نزیکەی چوار کیلۆ خۆراکیش بخاتە ناو هەگبەکەیەوە، تاکو بتوانێت بەسەر هەر مەترسی و کۆسپ و دوژمنێکدا - کە لەوانەیە بێنە ڕێی - سەربکەوێت).

پاش ئەوەی ئەم دوو سەربازە گوێیان لە وتەی ئەو ڕابەرە شارەزایە ڕاگرت، بەختەوەرەکەیان ڕێی ڕاستی هەڵبژارد. بەم چەشنە کۆڵێکی قورسی بە کێشی یەك باتمان خستە ئەستۆی خۆی، بەڵام "دڵ" و "گیان"ی لە منەت و ترس و ئازارێکی ئەوتۆ ڕزگاریان بوو کە بە هەزاران جاریش لەو کۆڵە قورستر بوو..

کەچی بەدبەختەکەیان لەبەر ئەوەی حەزی لە پەیڕەوی کردنی یاسا نەبوو، دەستی لە سەربازی هەڵگرت و ڕێگای چەپی هەڵبژارد. خۆ هەرچەندەش بە ڕواڵەت لە هەڵگرتنی ئەو کۆڵە قورسە ڕزگاری بوو بوو، بەڵام "دڵ و دەروون"ی کەوتبوونە ژێر منەت و ئازارێکی ئەوەندە قورسەوە کە بە هەزاران جار لە هەڵگرتنی ئەو کۆڵە قورستر بوو.. "گیان"یشی هەردەم لە ترس و بیمدا دەیناڵاند و، هەر کەسێکی لە ڕێگادا دەبینی دەستی لێ پان دەکردەوە و، لە گشت هەڵوێست و ڕووداوێکی ڕێگادا ترسی لێ دەنیشت! هەر بەم جۆرە ڕێی بڕی هەتا ڕۆشتە جێی مەبەست و، لەوێ بە سزای یاخی بوون و هەڵهاتنی خۆی گەیشت.

ئەوی تریشیان کە ڕێی ڕاستی گرتە بەر و پەیڕەوی ڕێبازی سەربازیی کرد و چەك و کەرەسەی خۆی پاراست، بە دڵێکی پڕ لە ئارامی و دەروونێکی پڕ لە هێمنییەوە ڕێگای بڕی تا گەیشتە جێگای مەبەست، بێ ئەوەی ئاوڕ لە کەس بداتەوە و منەتی کەس هەڵبگرێت، یاخود لە هیچ کەسێك بترسێت. ئیتر لەوێ - وەك هەر کەسێك کە ئەرکی سەرشانی ئەنجام دابێت - پاداشت و خەڵاتی شایانی خۆی وەرگرت.

ئەی دەروونی سەرکەشم!

بزانە ئەو دوو ڕێبوارە:

یەکەمیان ملکەچ و فەرمانبەردارانی یاسای خواوەندن.. مەبەست لەوی تریشیان ئەوانەن کە یاخی بوون و، شوێنی نەفس و ئارەزووی دەروونی خۆیان کەوتوون.

ئەو ڕێگایەش: ڕێی ژیانە کە لە "جیهانی گیان"ەوە دەست پێ دەکات و، لە گۆڕەوە تێپەڕ دەبێت و، لە جیهانی ئەودنیا کۆتایی پێ دێت.

ئەو چەك و هەگبە و تفاقەش بریتین لە: تەقوا و پەرستش، چونکە پەرستش هەرچەند لە ڕواڵەتدا ئەرکێکی قورس و گران بێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئاسانی و حەسانەوەیەکی ئەوتۆی تێدایە کە لە باسکردن نایەت، چونکە مرۆڤی خواپەرست لە نوێژەکەیدا "یەکتایی" خوا دەردەبڕێت و، دەڵێت: "أشهد أن لا إله إلاّ الله". واتە: جگە لە خوا هیچ بەدیهێنەر و ڕۆزیدەرێك نی‌یە و، هەموو سوود و زیانێکیش تەنها بە دەستی ئەوە. خوایەکی دانایە و هیچ شتێك بە هەڕەمەکی و بێ واتا و مەبەست ناکات، هەروەك بەخشندە و میهرەبانە و، چاکە و میهرەبانی‌یەکانیشی تابلێی گەورە و زۆر و فراوانن..

مرۆڤی باوەڕدار باوەڕی بەو گوفتارانەی خۆی هەیە کە ڕایاندەگەیەنێت. بۆیە لە هەموو شتێکدا دەرگانەی گەنجینەی میهرەبانی و بەخشندەیی خوا دەبینێت و، دەزانێت کە هەرچی شت هەیە لە ژێر دەستەڵاتی خوای پەروەردگاردایە. لەبەر ئەوە، هەردەم بە نزا و پاڕانەوە لە دەرگانەی ئەو گەنجینانە دەدات و، لە بەردەم هەموو گیروگرفتێکی دنیاشدا دەڕواتە ناو سەنگەری تەوەککولەوە و پشت بە پەروەردگاری خۆی دەبەستێت.

بەم چەشنە، مرۆڤی باوەڕدار لە ڕێگای "ئیمان"ەوە دڵنیایی و ئارامی و ئاسایشێکی تەواوی دەستگیر دەبێت.

بەڵێ، ئازایەتی و نەترسان، وەك هەموو کردەوەیەکی تری چاك، تەنها لە ئیمان و پەرستشەوە سەرچاوە دەگرن. ترس و بیم و هەر کردەوەیەکی تری خراپیش تەنها لە گومڕایی و کوفرەوە پەیدا دەبن.

خۆ ئەگەر گۆی زەوی بۆمبایەك بێت و بتەقێتەوە، لەوانەیە مرۆڤی خواپەرستی دڵ ڕووناك نەترسێنێت و، بە موعجیزەیەکی دەستەڵاتی پەروەردگاری بزانێت و بە ڕێز و سەرسووڕمان و چێژەوە لێی ورد ببێتەوە..

بەڵام مرۆڤی فاسقی دڵ مردوو، با فەیلەسووفیش بێت - کە بە خاوەن عەقڵ و ژیریی زیاد دادەنرێت - لەوانەیە گەر ئەستێرەیەکی کلکدار(مُذَنَّب) لە ئاسماندا ببینێت ئەم لەسەر زەوییەوە سامی لێ بنیشێت و بڵێت:

"ئایا بڵێی ئەم ئەستێرەیە خۆی بە زەویدا بکێشێت"؟

(شەوێك دانیشتووانی ئەمریکا کلکدارێکیان لە ئاسماندا بینی، لە تاوا سامیان لێ نیشت و، هەندێکیشیان هەر بەو شەوە خانووەکانیان چۆڵ کرد)!

بەڵێ، گومان لەوەدا نییە کە "پێویستییەکان"ی مرۆڤ لە ڕادە بەدەرن، کەچی "سەرمایەکەی دەستی" ئەوەندە کەمە لە حوکمی "نەبوو"دایە.. هەروەها ئەو "بەڵا و ناخۆشی"یانەی لە ژیاندا دێنە ڕێی یەکجار زۆرن، کەچی "توانا و دەستەڵات"ی هێندە لاوازە وەك "نەبوو" وایە. واتە: مەودای بازنەی سەرمایە و دەستەڵاتی مرۆڤ هەر ئەوەندەیە کە دەستی پێی دەگات، بەڵام بازنەی هیوا و ئاوات و، بازنەی بەڵا و ئازارەکانی لەو مەودایەدان کە چاوی بڕ دەکات و ئەندێشە و خەیاڵی بۆی دەچێت!

لەم بەراوردەوە بۆمان دەردەکەوێت:

"گیان"ی مرۆڤ، کە تا ئەم ڕادەیە لاواز و بێ دەستەڵات و هەژارە، چەندە پێویستی بە ڕاستییەکانی ئیمان هەیە، وەك: پەرستش و تەوحید و

ملكه‌چ كردن بۆ فه‌رمانه‌كانی خوا و پشت به‌ستن پێی. هه‌روه‌ها بۆمان ده‌رده‌كه‌وێت كه‌ هه‌ر كه‌سێك ئه‌م ڕێگایه‌ ده‌گرێته‌به‌ر به‌ختیاری و نیعمه‌ت و قازانجێكی یه‌كجار زۆر و گه‌وره‌ی ده‌ستگیر ده‌بێت. خۆ ئه‌گه‌ر بینایی دڵی له‌ ده‌ست نه‌دابێت، بۆ خۆی هه‌ستیان پێ ده‌كات.

وه‌ك ئاشكرایه‌ هه‌ر ڕێگایه‌ك بێ زیان بێت، با ڕێژه‌ی قازانجیشی یه‌ك له‌ ده‌ بێت، له‌ هه‌ر ڕێگایه‌كی زیانبه‌خش باشتره‌. خۆ ئه‌م ڕێگایه‌ی له‌م مه‌سه‌له‌یه‌دا مه‌به‌ستمانه‌ ڕێی به‌ندایه‌تی و په‌رستنی خوایه‌، كه‌ سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی هیچ زیانێكی نی‌یه‌ و ڕێژه‌ی قازانجیشی "نۆ له‌ ده‌"یه‌، له‌ هه‌مان كاتیشدا گه‌نجینه‌ی كامه‌رانیی هه‌میشه‌ییمان پێ ده‌به‌خشێت..

به‌ڵام ڕێی خراپه‌كاری، سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی بێ سووده‌ - هه‌روه‌ك ڕێڕه‌وانی دان به‌م ڕاستی‌یه‌دا ده‌نێن - هۆیشه‌ بۆ چاره‌ڕه‌شی و له‌ناوچوونی هه‌میشه‌یی. جگه‌ له‌وه‌ی كه‌ هیچ گومانێك له‌ زه‌ره‌ر و زیانیدا نی‌یه‌ كه‌ ڕێژه‌ی ده‌گاته‌ "نۆ له‌ ده‌".

ئه‌م ڕاستی‌یه‌ش به‌ شایه‌تیی ژماره‌یه‌كی زۆر له‌ چه‌سپێنه‌ران و پسپۆڕانی ئه‌م مه‌یدانه‌ چه‌سپاوه‌ كه‌ به‌ "ته‌واتور" و كۆی ده‌نگ شایه‌تییان له‌سه‌ر داوه‌، هه‌روه‌ك له‌ ڕێی هه‌واڵی "ئه‌هلی كه‌شف"یشه‌وه‌ چه‌سپاوه‌ كه‌ دڵنیاییه‌كی بێ گومان به‌ مرۆڤ ده‌به‌خشێت.

**له‌ مانه‌وه‌ به‌ پوختی ده‌گه‌ینه‌ ئه‌وه‌ی كه‌:**

به‌خته‌وه‌ریی دنیا - وه‌ك هی قیامه‌ت - له‌وه‌دایه‌ كه‌ ببین به‌ سه‌ربازێكی دڵسۆز و لێبڕاو له‌ په‌رستشی خوای گه‌وره‌دا.

كه‌واته‌، پێویسته‌ هه‌رده‌م بڵێین:

"الحمد لله على الطاعة والتوفيـــــق" و، شوكرانه‌ی خوای گه‌وره‌ بكه‌ین له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ كردووینی به‌ موسڵمان.

# وتەی چوارەم

بسم الله الرحمن الرحيم

**(الصَّلاةُ عمادُ الدِّين)**

ئەگەر دەتەوێت ڕادەی بەها و گرنگیی نوێژت بۆ دەربکەوێت و، بزانیت چ دەستکەوتێکی گەورەیە و، چۆن مرۆڤ ئەم دەستکەوتەی بە ئاسانی دەستگیر دەبێت..

هەروەها ئەگەر دەتەوێ گێلی و تێنەگەیشتنی ئەو کەسەت بۆ دەربکەوێت کە ئەم پەرستشە ئەنجام نادات و، بزانیت چەندە مرۆڤێکی زەرەرمەندە..

بەڵێ، ئەگەر حەز دەکەیت ئەمانە بزانیت و بە ئەندازەی (دوو کەڕەت دوو دەکاتە چوار) لێی دڵنیا بیت، ئەوا سەرنج لەم چیرۆکە کورتە بدە و لێی ورد بەرەوە:

جارێکیان فەرمانڕەوایەکی گەورە دوو خزمەتگوزاری خۆی بۆ باخچەیەکی تایبەتیی جوان و دڵڕفێن نارد کە دوو مانگ ڕێ دوور بوو، یەکی بیست و چوار لیرەی زێڕیشی دانێ تاکو پێی بگەنە مەزراکە و لەوێ نیشتەجێ بن و، پێی وتن:

(بلیت و پێداویستییەکانی گەشتەکەتان و پێویستییەکانی ناوماڵ و نیشتەجێ بوونتان، بەم پارەیە بکڕن.. دوای ڕۆژە ڕێیەکیش دەگەنە

ئیستگایەك کە هەموو هۆکارەکانی گواستنەوەی تێدایە لە ئۆتۆمبیل و، فڕۆکە و، شەمەندەفەر و، پاپۆڕ.. نرخی سواربوونی هەرکام لەمانەش لەوی تر جیایە و بە پێی سەرمایەی ئەو کەسەیە کە سواری دەبێت).

ئەوانیش دوای وەرگرتنی ئەم دەرس و ئامۆژگارییانە، کەوتنە ڕێ. یەکێکیان لەبەر ئەوەی مرۆڤێکی بەختەوەر و شادمان و ژیر بوو، بەشێکی پارەکەی بە جۆرێك فەرمانڕەوا پێی ڕازی بێت، خستەکار و کەسابەتەوە تا گەیشتە ئیستگاکە و، سوود و قازانجێکی زۆری لێ دەست کەوت بە چەشنێك کە سەرمایەکەی یەك بۆ هەزار زیادی کرد.

بەڵام ئەوی تریان لەبەر ئەوەی هەرزە و بەدبەخت بوو، تا گەیشتە هەمان جێ، بیست و سێ لیرەی بە قومار و هەڵەخەرجی بە زایە دا و تەنها یەکێکی پێ مایەوە!

لەبەر ئەوە، هاوڕێکەی پێی وت:

کاکی خۆم! ئەم لیرەیەی ئێستا پێت ماوە بلیتی سەفەری پێ بکڕە و بە خۆڕایی لە دەستی مەدە، بۆ ئەوەی لەم ڕێگا دوور و درێژەدا بە برسێتی و ئاوارەیی نەمێنیتەوە. فەرمانڕەوای گەورەشمان تابلێی لێبوردە و جوامەردە، بەڵکو لە کەموکوورییەکانت خۆش ببێت و تۆش سواری فڕۆکە بکات و پێکەوە لە ماوەی ڕۆژێکدا بگەینە نیشتەجێی خۆمان. خۆ ئەگەر بە گوێیشم نەکەیت، ئەوا ناچار دەبیت کە بە پێ بکەویتە ڕێ و بە دوو مانگی ڕەبەق و بە برسێتی و نامۆیی و تەنیایی ئنجا ببڕیت و بگەیتە جێ.

جا ئەگەر ئەم هاوڕێیە سەرپێچیی نواند و، بەو تاکە لیرەیەی پێی ماوە بلیتەکەی نەکڕی - کە وەك کلیلی دەرگای گەنجینەیەك وایە - بەڵکو لە پێناوی حەز و چێژێکی سەرپێیدا بەکاری هێنا، ئایا تەمبەڵترین مرۆڤیش تێناگات کە ئەو کەسە چەندە بەدبەخت و زەرەرمەند و گێژ و گەلحۆیە؟

